# کورتە باسێك لەسەر ڕەوتی
# بەناو (قورئانییەکان) و
# چۆنیەتی مامەڵە لەگەڵ (سوننەت)

مێژووی سەرهەڵدانیان، بەشێك لەبۆچوونەکانیان

مەترسی بیرۆکەی ئیکتیفا بە قورئان

د. عمر عبد العزیز

١٤٣٦ ك / ٢٠١٥ ز

www.iqra.ahlamontada.com
منتدى إقرأ الثقافي



# کورتە باسێك لەسەر رەوتی بەناو (قورئانییەکان)و چۆنیەتی مامەڵە لەگەڵ (سوننەت)

**مێژووی سەرهەڵدانیان، بەشێك لە بۆچونەکانیان**

**مەترسی بیرۆکەی ئیکتیفا بە قورئان**


## د. عمر عبد العزیز



١٤٣٦ ك/ ٢٠١٥ ز

* سەرەتایەکی مێژوویی و، چەند ڕاستییەکی گرنگ.

* هەندێک لە ڕابەرو ناودارانیان.

* هەڵەی گەورەیان و، وەڵامی بۆچوونەکانیان.

* چۆینەتی مامەڵە لەگەڵ (سوننەت).

بسم الله الرحمن الرحيم

پێشەکییەك لەسەر سەرهەڵدان و ناوو پێناس

لەبەر هەندێك هۆکاری بابەتیی و، بەشێك لە گرفتە سیاسییەکانی ناوخۆی ئوممەتی ئیسلامیی، لە سەدەی یەکەمی کۆچییەوە - بە تەواویی لە سەردەمی خەلیفەی چوارەمی موسڵمانان عەلی کوڕی ئەبو تالیبەوە (خوا لێی ڕازی بێت) - دەستەو تاقمێك لە (خەواریجەکان) پەیدا بوون کە کەوتنە بیری ڕەدکردنەوەی فەرمودەو سوننەتی پێغەمبەری خواو، بانگەشە کردن بۆ کردنی قورئانی پیرۆز وەك تاکە سەرچاوەی تەشریع و وەرگرتنی حوکمە شەرعییەکان.

ڕەوت و چالاکیی ئەمانە بەدرێژایی مێژوو هەڵکشان و داکشانی زۆری بەخۆیەوە بینی. زانایان و دەسەڵاتی ئیسلامیی سەرەتا زۆر دڵسۆزانە لە ڕێی گفت و گۆوە هەوڵی زۆریان لەگەڵدان کە بێنەوە سەر ڕێ، دواجار زانایان ڕاشکاوانە قسەی خۆیان بەرامبەریان کردو، بە لادەرو تێکدەرو تێنەگەیشتوو لە قەڵەمیان دان. دەسەڵاتی ئیسلامیش - بە هاوکاریی ئەو بۆچوونەی زانایان - ئیجرائاتی خۆیان لەگەڵ کردن.

ئەمانە لە سەدە پێشووەکانی مێژووی ئیسلامدا ناوێکی دیاریکراویان نەبوو، چونکە لە سەرەتاوە لە (خەواریجەکان)ی دوژمنانی پێشەوا عەلی، پێك هاتبوون، دوایی ژمارەیەك لە (موعتەزیلە) و (روافض) و (کەلامییەکان) تێکەڵیان بوون، هەندێك جار زانایان دەستەواژەی (زنادقە)یان بۆ بەکار هێناون.

ئەم ڕەوتە بەدرێژایی چواردە سەدەکەی مێژووی ئیسلام، ناوبەناو سەریان هەڵدەدایەوە، جارجاریش کپ دەبوونەوە. بەڵام کاتێك لە سەدەی هەژدەی

زاینیدا لە بەشە موسڵمانەکەی وڵاتی (هیندستان)دا - لە گەرمەی پەلاماری ئینگلیزەکاندا - سەریان هەڵدایەوە، ناوی (أهل القرآن)یان لەخۆیان ناو، ناوبانگییان بە (قورئانییەکان) دەرکردو، ئینگلیزە داگیرکارەکان دەستیان بە پشتیاندا هێناو، هاوکارییان کردن و، ڕابەرەکانیان خەڵات کردن..

ئەم تاقمانە، دەستەواژەی (أهل القرآن)یان بەرامبەر (أهل السنة) بۆ خۆیان داناوە، بە مەبەستی خۆجیاکردنەوە لە تەواوی موسڵمانان، کە لای ئەوان ئەم زۆرینەیەی کە بە (أهل السنة) ناسراون، گومڕان و، لە مەنهەجیەتی دروستی قورئان، لایان داوە، چونکە شوێنی ڕیوایات کەوتوون، کە لای ئەوان هەموو ڕیوایەتەکان بە هەڵبەستراوو ناڕاست دەزانن و، ڕەدیان دەکەنەوە، لەبەر ئەوەی ڕاوییەکانیان بەلای ئەوانەوە یان پشتگیری عەلی بوون، یان مەعاویە، یان لیژنەی ئاشتیی نێوانیان، کە هەر سێ لایان لای ئەوان ڕیوایەتیان قبوڵ نیەو، شایەتییان وەرناگیرێت، بگرە لەسەر ئەسڵی ئیمان و موسڵمانێتی زۆربەشیان قسەیان هەبووە.

سەبارەت بە دەستەواژەی (أهل السنة): ڕاستە کە لە قورئانی پیرۆزدا نەهاتووە، بەڵام لە سەدەی یەکەمی کۆچییەوە بووە بە وەصف و پێناس بۆ ئەو کەسانەی کە لەسەر ڕێبازی گەورە زاناکانی ئوممەتی ئیسلام ماونەتەوە. دیارە ئەم ناوە (ئەهلی سوننەت) لەکاتێدا بوو بە پێناس و نازناو، کە چەندین گروپ و دەستەو تاقمی تر سەریان هەڵداو، بەرامبەر ئەو دەستەو تاقمانە ئەم نازناوە ڕەواجی پەیدا کرد، بە مەبەستی جیاکردنەوەو ناسینەوە، وەگەرنا لەڕووی مەنهەجییەوە دەکرێ قسە لەسەر ئەو ناوەش بکرێت، چونکە خوای گەورە

لەقورئانی پیرۆزدا ناوی لە ئوممەتی ئیسلام ناوە (موسڵمان)، دەفەرموێ: ﴿هو سماكم المسلمين من قبل﴾.

بەهەرحاڵ، ئەم کورتە باسەی لەبەردەستی خوێنەری بەڕێزدایە، هەوڵێکی سەرەتاییە بۆ خستنەڕووی هۆکارەکانی سەرهەڵدانی یەکەمجاری ئەو دەستەو تاقمانەو، فاکتەرە هاندەرەکانی سەرهەڵدانەوەیان لەم سەردەمە هاوچەرخەدا. لەگەڵ ئاگاداربوون لە بنەما فکرییەکانی بیرکردنەوەیان و، وەڵامدانەوەی گرنگترین بۆچوونە هەڵەکانیان.

مەترسیدارترین دەرکەوتەی ئەم ڕەوتو ڕێبازە بریتیە لەڕەدەکرنەوەی زۆربەی زۆری حوکمە ئیسلامیەکان، بەوپێیەی کە لە (سوننەت)ەوە وەرگیراون، وەك سەرچاوەی دووەمی تەشریع. واتە هەر حوکمێك بە ڕوونیو دوروو درێژی لەقورئاندا باس نەکرابێت، ئەوان قبوڵیان نییە، وەك زۆرێك لەبڕو شێوازی زەکات (انصبة الزكاة) یان مەناسکی حەجو عومرە یان ئەحکامی هاوسەرگیریو جیابوونەوە.

ئامانج لەم هەوڵەش، ئاگاداربوونەوەی نەوەی نوێی ڕابوونی ئیسلامییە لەهۆکارەکانی سەرهەڵدانی ئەو دەستەو تاقمانەو، دوورکەوتنەوە لەو ڕەوتە نوێیەی کە بێ ئاگایانە ڕەواج بەو بیرۆکە ترسناکە دەدەن، بەهیوای تێگەیشتنێکی هاوسەنگ لە بابەتە فکرییەکان و، دوورکەوتنەوە لە پەرگیریی و تێگەیشتنی لاسەنگ لەو بنەمایانەی پەیوەندییان بە سەرچاوەکانی تەشریع و ئەحکامەوە هەیە.

## هەوڵە ڕیفۆرمیی و ئیصلاحییەکان جیاوازن لەم ڕەوتە:

لە کۆتایی ئەم پێشەکییەدا پێویستە ئەوە بڵێین: کە لەسەردەمە جیاجیاکانی مێژووی ئیسلامدا، ڕەوتێکی چاکسازیی بەردەوام هەبووە، بۆ گەڕانەوە بۆ قورئانی پیرۆزو سوننەتی کردەیی پێغەمبەر (ﷺ)و، خاوێنکردنەوەی فیکری ئیسلامیی و کەلەپوری فیقهی لە زۆرێك لە خەوش و خاڵی ڕیوایەتی هەڵبەستراوو لاوازو، بۆچوونە دژ بە قورئانەکان، کە بەهۆی زیادەڕۆچوون لە ڕیوایاتدا کەوتنە ناو کتێب و سەرچاوەکانیشەوە.

ئێمە لەم باسەدا کە قسە لەسەر (قورئانییەکان) دەکەین بەهیچ شێوەیەك مەبەستمان ئەو ڕەوتە ئیصلاحییە خەمخۆرەی فکری ئیسلامیی نیە، کە هەوڵ دەدات بۆ گێڕانەوەی قورئانی پیرۆز بۆ کۆڕی ژیان و، ئاشناکردنەوەی موسڵمانان بە پەیامەکەی، کە خۆمان بەبەشێك لەو ڕەوتە دەزانین، بەڵکو بە تەواویی و ڕوونیی مەبەستمان ئەوانەن کە لەژێر ناونیشانی پشتگیریی لە قورئاندا- بەبێ زانیاریی دروست و بەبێ کەرەستەو تفاقی زانستیی- کەوتوونەتە باسی ڕەتکردنەوەی فەرمودەو، بانگەشە بۆ بیرۆکەی (ئیکتیفا بەقورئان)- ئەویش بە تێگەیشتن و تەفسیری خۆیان - کە بیرۆکەیەکی کۆنی خەواریجەکانە.

واتە: نابێت هەوڵی چاکسازیی و ڕیفۆرم لە فیکری ئیسلامیداو، تەقالای زاناو بیرمەندانی دڵسۆز، تێکەڵ بەباسی ئەو تاقمانە بکرێت کە لە کرۆکی ئاین و، رایەڵەی چاکسازیی دوور کەوتونەتەوە. چ ئەوانەی ناوی خۆیان ناوە (اهل القرآن) یان (قرآنیون)، یان هەر ناوێکی تر. لایەنگرانی ڕەوتی نوێبوونەوە لە

فکری ئیسلامیدا، لە هەوڵی پێداچونەوەی تەفسیری هەڵەی هەندێك ئایەت و، ڕاستکردنەوەی ڕاڤەی نادروستی هەندێك فەرمودەو، ئاڵ و گۆڕی هەندێك فتواو ڕاو بۆچوونی بەسەرچوون، کە یان لە بنەڕەتدا لاواز بوون، یان بۆ کاتی خۆیان گونجاو بوون و، بۆ سەردەمی هاوچەرخ لەبارو سازگار نین.. ئەم دوو کارو ئامانج و مەبەستە زۆر لەیەك جیاوازن و، دوو ڕێبازی لێك دوورن، نابێت کەسەکان و باسەکانیان تێکەڵ بکرێن.

هیواداریین خوێنەران لەم سەرەتایەوە ئەم سەرنجە بە هەند بگرن و، ئەو دوو مەودایە لەلایان تێکەڵ نەبێت و، ئەم نامیلکە دەستپێکەش خزمەتێك بکات..

## یەکەم/ سەرەتایەکی مێژوویی و، چەند ڕاستییەکی گرنگ

### ١ـ سەرەتای بیرۆکە لە ناکۆکییەکانی سەردەمی خەلیفە (عەلی) یەوە:

بیرۆکــەی ڕەخنــەگرتن لــە سەرچــاوەکانی فــەرمودەی پێغەمبــەر ﷺ دەگەڕێتەوە بۆ سەردەمی (خەواریجەکان)[١]، کاتێ برپاریـان دا هـیچ فەرمودەیـەك لەو (صەحابە)و (تابعی)یانە وەرنەگرن کە پشتیوانی عەلی و معاویـە بـوون، یـان لەگەڵ ناوبژیوانیدا بوون لە جەنگی (صەففین)دا، بەو پێیەی ئەو دوو هەڵوێستە (بەشداریی شەڕەکان)و (ئاشتەوایی) دژی حوکمی قورئـانن‌و، سـەرەنجام مایـەی لەدەستدانی مەرجی متمانەن لە ئایندا.. بۆیە (خـەوارج) هـەر فەرمودەیـەك لـە سـەنەدەکەیدا کەسـێکی لـەو (صـەحابەو تابعین)انـەی تێـدا بووبـێ، ڕەدیـان کردۆتەوەو بە هەڵبەستراویان زانیوە. یان بەلای کەم بە حوججەتیان نەزانیوە.

ئەم خەواریجانە هاوشێوەی (بیۆریتانە مەسیحییەکان)[٢]یان بەسەر هات خاوەنی (مەزهەبی پاکیی)، کە ژمارەیەك لـە برۆتسـتانتە ئینگلیزەکـانی سـەدەی پـازدەی

---

[١] خەواریج گروپێك لە سەربازانی عـەلی کوڕی ئـەبو تالب بـوون (خـوا لێـی ڕازی بێـت)، کـە لەبەر ڕازیبوونی بە ناوبژیوانیی (تەحکیم) لە جەنگی (صەففین)دا، دژی هەسـتان. لەوێشـەوە نـاونران (خـەواریج)، واتـە: دەرچـووەکان. پێشیان دەگـوترا (الحروریـة)، چـونکە مەڵبەنـدی گردبونەوەیان شوێنێك بوو بەناوی (حروراء). بەڵام خۆیان ناوی خۆیان نـابوو (شـراة) واتـە: فرۆشیاران، بەو پێیەی وایان دانابوو گیانی خۆیان فرۆشتووە بـە خـوا. ئەوانـە پـەیمانیان دا بە کەسێك بەناوی (عبد الله بن وهب الراسبي)و، لە جێی خەلیفـە عـەلی ئـەویان ناونـا (امـیر المؤمنین). جەنگێکی گەورە لە نێوان ئەوان و سوپای عـەلی ڕووی دا بـەناوی (نـەهرەوان). بـۆ زانیاری زیاتر بڕوانە ؛ (الملل والنحل)ی شەهرستانی، ١٧٠/١ بەرەو ژوور. هەروەها: الفرق بـین الفرق، الشهرستانی، لا: ٧٣.

[٢] بڕوانە (النظم الإسلامیة)، دیمۆمبین، لا: ٤٨، بە نـەقڵ لـە: (١٠ ثـورات في الإسـلام، د. علـي حسني الخربوطلي، دار الآداب، بیروت، ط٢، ١٩٧٨، لا، ٥٠).

زاینــی بـوون و، بانگەشــەی پاککردنــەوەی کەنیســەیان دە کــرد لــە گەنــدەڵیی و بیدعەو داهێنراوەکـان، بـەڵام خۆشیان سەرچاوەی لادان و سەرکەشـیی بـوون و، نەیانتوانیی کاریگەرییەکی ئەوتۆ بەجێ بهێڵن.

خــەواریجیش لای خۆیانــەوە ســەرەتا هــەمان لافیــان لێ دەدا، گوایــە ئیسـلام بگێڕنــەوە بـۆ سەرچاوە بنــەڕەتیی و بـێ خەوشـەکەی خـۆی کـە قورئانــە، بـەڵام دواتـر بیرۆکەو ئامانجەکە لە دەستیان دەرچوو، پەیڕەوانیان لـە ڕایەڵەی ئیسلام ترازان و، جوڵانەوەکەیان بە ئاقارێکی تردا چەرخا.

**٢- بەشدارانی ناکۆکییەکان ڕیوایەتیان ڕەد کرایەوە:**

جا بەو پێیـەی کـە زۆربـەی صـەحابەو تـابعین - هەریـەك بـە شـێوەیەك لـە شێوەکان- یان لەو ڕوداوانەدا بەشدار بوون، یان لەگەڵ ناوبژیوانیی بوون، وای لێ هـات کـە خــەواریج ڕێژەیــەکی زۆری ئــەو فەرمودانــە ڕەد بکەنــەوە کــە ئــەوان گێڕاونیانەتـــەوە، مەگـــەر ئـــەو ڕیوایەتانـــەی لـــە کەســـەکانی خۆیانـــەوە گوێزراونەتــەوە. ئــەوان دەیــانگوت خــوا فەرمویــەتی: (ان الحكـم إلا لله)،[٢] بــەڵام عەلیو ناوبژیوانان بە حوکمی خوا کاریـان نـەکرد. بۆیـە سـەرەنجام کـار گەیشـتە ئەوەی عەلی و تەلحەو زوبەیرو ئەبو موسای ئەشعەری و عەمری کوڕی عـاص و پشـتیوان و لایـەنگرانیان (خــوا لێیــان ڕازی بێــت) بــە کــافر بــزانن، ج جــای ڕیوایەتــەکانیان قبـوڵ بکـەن. دواتــر کــار گەیشــتە ئــەوەی هەنــدێکیان هــەموو خــەڵکییان تـەکفیر کـرد، جگـە لـە پـەیڕەوانی خۆیـان، بـەو پێیـەی خـەڵکیی لـە ناهەقیی بێدەنگ بوون. !

---

[٢] بۆ درێژەی ئەم بابەتە بڕوانە (الملل والنحل)ی شەهرستانی ١/١٧١.

**٣- لە بۆچوون و هەڵوێستێکی سیاسییەوە، بۆ بۆچونێکی فکریی:**

ئـەم بۆچـوونە سـەرەتا لـە فـۆرمێکی کـاڵ و خامـدا بـوو. دەتـوانین بڵـێین بۆچونێکی سیاسی بـوو، بـەڵام دواتـر بـووە ڕێبـازو مەسلەکێکی فکریـی و، بـەرگی ئیجتیهادیان کرد بەبەریداو، بوو بە بۆچوونێکی مەزهەبیی. ڕاستە وەك مەزهـەب ناوێکیان لە خۆیان نەنا بوو، بەڵام بیرۆکەکە گەرای لێ کەوتـەوەو، ئـەو ڕێبـازەی لێ هاتـە بەرهـەم کـە دواتـر نـاونرا (ڕێبـازی قورئانییـەکان)، چـونکە کاتـێ زۆربـەی فەرمودە ڕەد بکرێتەوە، دیارە تاکە سەرچاوەی جێـی متمانـە بـەلای ئەوانـەوە کـە بمێنێتەوە هەر قورئانی پیرۆزە، ئەویش بە تەفسیرو ڕافەی تایبەتی خۆیان.

دواتـــر، بـــە پاڵنـــەری تـــرو لـــە ڕێـــی هۆکـــاری تـــری سیاســـی و مەزهـــەبیو (کەلامی)یـــەوە، شـــیعەکان و بەشـــێك لـــە زانایـــانی زانســـتی کـــەلام - بەتایبـــەتی هەنـــدێك لـــە زانایـــانی گروپـــی موعتەزیلـــە - کەوتنـــە داوی هـــەمان بۆچـــونی خەواریجو، گومان دروستکردن لەسەر کۆی فەرمودەو سەرچاوەکانی فەرمووده.

**٤- پاش ڕەدکردنەوەی ڕاوییەکان، ڕەدکردنەوەی ئەحکام سەری هەڵدا:**

لە قۆناغێکی تردا گرفتی گەورەتر دروست بوو، ئەویش ئەوە بوو کاتێك کـە زۆربەی سوننەت و فەرمودە لای ئەوان ڕەد کرانەوە، لەگەڵیا زۆربەی (ئـەحکامی تەفصیلی)ش ڕەد دەکرێنـەوە. چونکە وەك ئاشـکرایە زۆرێـك لـە ئەحکامـەکانی ڕوکنە بنچینەییەکانی ئیسلام لە قورئاندا تەنها ئاماژەیان پـێ کـراوەو درێـژەیان پـێ نـەدراوە، بـۆ نمونـە: چۆنیەتی نوێـژ، ژمـارەی ڕکاتـەکانی، کاتـەکانی نوێـژ، زیکری ناو ڕوکنەکانی. هەروەها ڕێژەو بڕی زەکاتی زێڕو زیوو ئاژەڵ و بەروبوم، یان چۆنیەتی جێبەجێ کردنی هەندێ لە مەناسکەکانی حەج و.. هتد.

بۆیـــە لـــەناو خەواریجـــدا قســـەی وا ســـەری هەڵـــدا کـــە نوێـــژ تـــەنها وتنـــی تەسـبیحاتێکە لـەو کاتانـەدا کـە قورئـان باسـی کـردوون، واتـە کاتـەکانی (دلـوك

الشمس) و (غسق الليل) و (الفجر) و (قبل طلوع الشمس) و (بعد الغروب)و.. هتد. تەنانەت گروپێکیان لێ جیابوونەوە بە ناوی (الميمونية)، بڕوایان وابوو کە ڕەوایە پیاو کچەزای خۆی (واتە: کچی کچی خۆی) یان (کچی کوڕی خۆی) لەخۆی مارە ببڕێت، چونکە لە (محرمات)ی قورئاندا باس نەکراوە.[4]

٥- شەڕە ڕیوایەت و زۆربوونی ڕیوایەتی هەڵبەستراو:

لەبەر ئەو کارو کاردانەوە هەڵانەو، ئەو ڕوداوانەی لێیان کەوتنەوە، دەیان ڕیوایەتی دژ بەیەك دروست کران. بۆ نمونە بەرەی لایەنگری دژە فەرمودە، ڕیوایەتی زۆریان تاشی کە قورئان کافییەو، هەرچی فەرموودە هەیە دەبێت لەبەردەمی قورئاندا دانرێ، ئەمەش بووە دیاردەیەکی هەوەسکاریی و، هەرکەس فەرمودەیەکی بەدڵ نەبوایە، دەیگوت لەگەڵ فلان ئایەت یەك ناگرێتەوە. بۆ نمونە ئەم ڕیوایەتەیان هەڵبەست: (إذا جاءكم الحديث فأعرضوه على كتاب الله، فإن وافقه فخذوه[5]..)، واتە: ئەگەر فەرمودەتان هاتە ڕێ، بیگرن بەڕووی قورئاندا، ئەگەر پێی خوارد، وەری گرن.

بەرەی دژیشیان - واتە ئەوانەی بەزیادەڕەویی ویستیان بەڵگەبوونی فەرمودە بسەلمێنن – چەندین ڕیوایەتیان هەڵبەست دەربارەی حوجییەتی فەرموودە. بۆ نمونە لە هەڵبەستراوێکدا هاتووە: (كان جبريل ينزل على النبي بالسنة، كما ينزل عليه بالقرآن).[6] واتە: جبریل هەروەك قورئانی بە وەحی بۆ پێغەمبەر دەهێنا، سوننەتیشی بۆ دەهێنا، کە هیچ کام لەو دوو ڕیوایەتە ڕاست نین.

---

٤ بڕوانە (شبهات القرآنيين حول السيرة النبوية، د. محمود محمد مزروعه، لا: ٢٣)،

٥ ئەم ڕیوایەتە، ناڕاست و هەڵبەستراوە. (خطابی) دەڵێت: ڕیوایەتێکی پووچ و بێ بنەمایە. (يحيى كوڕی معين)یش دەڵێت: زندیقەکان هەڵیان بەستووەو دایانناوە. دەیان زانای تریش بە هەڵبەستراوو درۆیان داناوە. (عون المعبود، العظيم آبادي).

٦ ئەم ڕیوایەتەش ناڕاست و هەڵبەستراوە، لە (سنن الدارمي، المقدّمة، باب السنة قاضية على كتاب الله ١/١١٧، بە ژمارە ٥٨٨، هاتووە. بەڵام ڕیوایەتێکی (مقطوع)و سەنەد پچڕاوە.

**٦- سەرگەرمبوونی زانایانی فەرموودە:**

ململانێی ئەو دوو بەرمیەی سەرەوە، بە تەواوی زانایانی فەرمودەناسی سەرگەرم کرد، دەیان زانا تەمەنی ٧٠ و ٨٠ساڵی خۆیان لە پێناوی پاککردنەوەی سەرچاوەکانی فەرمودە لەم جۆرە ڕیوایەتە هەڵبەستراوانە بەسەر برد. بەڵام ئەو ڕاستییە ناشاررێتەوەو ئینکار ناکرێت کە زانایان زۆر ماندوو کران، سەرەنجام لەگەڵ ئەوەی پێودانگ و ترازووی زانستیی وردیان بۆ وەرگرتن و ڕەتکردنەوەی ڕیوایەت دانا، بەڵام بە هەزاران فەرموودە کەوتنە ناو سەرچاوەکان و تێکەڵ بوون بە فەرمودە دروستەکان.

بۆ سەلماندنی ئەم ڕاستییە - واتە مەشغولکردنی زانایان - ئەم بەسەرهاتە بەسە، کە لە درۆزنێکی هەڵبەستی ڕیوایەتەوە دەیگێڕنەوە، دەڵێن: درۆتاشێك بەناوی (عبد الکریم کوڕی ابو العوجاء)، لەبەر هەڵبەستنی زۆری بۆ ڕیوایەتی درۆینە بەدەمی پێغەمبەرەوە، حوکمی کوشتنی بۆ دەرچوو. لەکاتی جێبەجێکردنی حوکمەکەدا گوتی: "ئاگادار بن! بەخوا ئەگەر بیشمکوژن، تازە چوار هەزار فەرمودەم بەدەم پێغەمبەرەوە هەڵبەستووە، حەڵاڵم تێدا حەرام کردووە، حەرامم تێدا حەڵاڵ کردووە. بەخوا لە ڕۆژی ڕۆژووگرتنتاندا، ڕۆژووم پێ شکاندوون. لەڕۆژێکدا کە نەدەبوو ڕۆژووی تێدا بگرن، ڕۆژووم پێ گرتوون، (دیارە مەبەستی ئەومیە شایەتی درۆینەی داوە بۆ بینینی مانگ)!.."[7]

[7] ئەم باسە لەم سەرچاوانەدا هاتووە: تاریخ الطبري، ٢٩٩/٦. (البدایة والنهایة)ی (ابن کثیر)، ١١٣/١٠.

ئەمــە مشــتێکە لــە خــەرواری فــڕو فێــڵو هــەوڵی تێکدەرانــەی درۆزن و هەڵبەستانی ڕیوایەت، کە بە هەزاران مەزندە دەکرێن و، دەیان کتێبیـان لەسـەر نوسـراوە[^]و، هـەر گـروپ و تاقمێکیـان بـە پاڵنـەرو ئامانجێکـەوە ئـەو کارانـەیان کردووە، هەر لە خیانەت و دوڕویی و خزمـەتی جولەکەو مەجوسییەکانەوە، تا دەگاتە نیەتباشیی و ئیرادەی خێرو چاکەو، هانـدانی موسـڵمانان بـۆ چاکەکردن، بەخەیاڵپڵاویی و نەزانیی خۆیان.

**٧- بەرەنگاربونەوەی دیاردەکەو، کاریگەریی کارو کاردانەوەی هەڵە:**

ئــەم ڕێبـازو بۆچـوونە خەواریجییــە، درێــژەی هــەبوو. زۆرجـار دەســەڵاتی ئیسلامیی ئـەو سـەردەمانە - بـە پاڵپشـتیی زانایـان - دژیـان دەوەسـتانەوەو کـپ دەبوونــەوە. بــەڵام لــە زۆر ســەردەمی تــردا دەبوژانــەوە. هەنــدێك لــە کەسـایەتییەکانیان وەك قەناعـەت داکۆکییـان لـەو ڕێبـازە دەکـرد. واتـە لافـی پاراسـتنی سەرچـاوەی تەشـریعیان لێ دەدا لـە ڕیوایـەت و قسـەی هەڵبەسـتراو. هەنـدێکی تریـان بـەبێ ئـەوەی بـە خۆیـان بـزانن لـە پێگـەی پێغەمبەرایـەتیی و بایــەخی سەرچــاوەی (ســوننەت)یان کــەم کــردەوە، وەك دووەم سەرچــاوەی تەواوکاری تەشریع لە ئیسلامدا.

[^]نمونەی ئەو کتێبانە: ١-المجروحين، يحيى بن معين. ٢- المجروحين من المحدثين والضعفاء والمتروكين، محمد بن حبان البستي. ٣- الشجرة في أحوال الرجال، الجوزجاني. ٤ و ٥- الضعفاء الكبير، والضعفاء الصغير، البخاري. ٦- الضعفاء والمتروكين، النسائي. ٧- المجروحين من المحدثين والضعفاء والمتروكين، ابن حبان. ٨ و ٩- الضعفاء والمتروكين، ابن الجوزي والدارقطني. ١٠- المغني في الضعفاء، الذهبي و، چەندینی تریش هەن.

ئەوەش مەعلومە کە کارو کاردانەوەی هەڵەش کاریگەریی هەبووە لەسەر ڕەواجدان بە بیرۆکەکە. واتە: لە سەرێکەوە هەندێك (واعظ)ی نەزان بە گێڕانەوەی ڕیوایەتی هەڵبەستراوو، ناشیرینکردنی مینبەرەکان و، گوێنەدان بەپێوەری زانستیی و قسەی زانا دڵسۆزەکان، دەبوونە هۆی برەودان بەو تاقمە. لە سەرێکی تریشەوە مامەڵەی نابەرپرسانەی هەندێك والی و دەسەڵاتدارو، توندوتیژیی و ستەمیان بەرامبەر ئەو خاوەن بۆچوونانە، ئەوەندەی تر ئاودێریی حاڵەتە نەخوازراوەکەی دەکردو، وای دەکرد کە پێداگریی بکەن لەسەر بۆچونەکانیان، کە ئەگەری ئەوە زۆر بوو لەڕێی گفت و گۆو، سازدانی کۆڕی زانستیی و دایەلۆگی لۆژیکییەوە، زۆرێك لەتەنگژەکان چارەسەر ببن.

٨- گرانبوونی ئەرکی زانایانی فەرمودەناس و، گەشەکردنی (علوم الحدیث):

ئەو خاڵەی سەرەوە بارگرانییەکی زۆری بۆ زانایانی فەرمودە - بە تایبەتی هەڵگرانی زانستی (جەرح و تەعدیل)، بە تایبەتی تر زانایانی زانستی (إسناد)و (رجال)- دروست کردو، کەوتنە بیری هەڵسەنگاندنی وردی سەنەد (زنجیرەی ڕاوییەکان)و، دواتر دەیان کتێبی بە بایەخ لەو بارەیەوە نوسران.

بەڵام هەر ئەو حاڵەتە - واتە زیادە گرنگیدان بە سەنەدو (علم الروایة)، لەبەر ئەو هۆکارەی سەرەوە - حاڵەتێکی تری نەخوازراوو نامۆی لێ کەوتەوە، کە بریتی بوو لە کەمبونەوەی بایەخدان بە (مەتن)و (علم الدرایة)و ناوەرۆکی فەرمودە. واتە: لە سەرەتای سەرهەڵدانی زانستەکانی فەرمودەوە، بڕیار نەبوو کە هەوڵەکان هەموو لە هەڵسەنگاندنی کەسەکان و سەنەددا چڕ ببنەوە، بەڵام شاڵاوی گومان دروستکردن لەسەر ڕاوییەکان و، ئەو کارو کاردانەوانەی نێوان پەیڕەوانی ئومەوی و عەلەوی و ئال و بەیت، وای کرد کە زانایانی بوارەکە نەیانپەرژێتە سەر لایەنی (مەتن)و دەقی فەرمودە، بە مەرجێ خۆیان لە

باسەکانی مەرجی دروستیی فەرمودەدا لە سەرەتاوە باش بۆی چوون کە باسیان لەدوو مەرج کردووە، کە نابێ ڕیوایەت (شاز)و (معلل)[9] بێت، بەڵام زۆر دەستیان دانەگرت لەسەر دوو ڕاستی زۆر گرنگ لە ڕووی دەقی ڕیوایەتەوە:

یەکەم: بەراوردکردنی دەقی فەرمووده لەگەڵ واتاو مەدلولە ڕوونەکانی دەقەکانی قورئان بە نیازی هەڵسەنگاندن.

دووەم: بەراوردکردنی دەقی فەرمووده لەگەڵ ڕێساو بنەما قورئانییەکان (قواعد)و (ضوابط)ی گشتیی.

بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا، لەم نێوەندەدا - واتە لەنێوان دروستیی و ڕاستیی ئەو بۆچونە کە قورئان هەموو ئەحکامی تێدا نیە، لەگەڵ ئەو ڕاستییەدا کە ڕیوایەتی هەڵبەستراوو لاوازی زۆر تێکەڵ بوون بە فەرمودە - هەر لە سەرەتاوە زانایانی زۆر هەلکەوتن و، کەوتنە بیری تەتەڵەو بێژنگی ڕیوایات. بۆیە مێژوو باس لە هەوڵی تاقەتپڕوکێنی زانایانی ناوداری وەك بوخاری (٣٠٦ - ٣٨٥ ك)و، موسلیم (٢٠٦ - ٢٦١ ك)و، دارە قوطنی (٣٠٦ — ٣٨٥ ك)و ئەوانی تر دەکات، لە پرۆسەی مشت و مالکردنی فەرمودەدا.

بەڵام ئەو ڕاستییەش حاشای لێ ناکرێ کە نە ئەوان و نە کەسانی دواتریش دەرەقەتی ئەو شالاوەی هەڵبەستنی ڕیوایەت نەهاتن و، نەیانتوانی ئەو سەرچاوانە کە بە (صحاح)و (سنن)و (مسانید) ناسراون لەریوایەتی لاوازو هەڵبەستراو پاك بکەنەوە. بۆیە هەندێك لە زانایانی پێشوو - وەك پێشەوا

---

٩ (شاز): ئەو ڕیوایەتەیە کە تاك کەوتووەتەوەو، ڕیوایەتی لەو بەهێزتر دژیەتی. بەڵام (معلل) یان (معلول): ئەو ڕیوایەتەیە کە عیللەتێکی شاراوە ڕوو دەکاتە سەنەدەکەی یان مەتنەکەی. ئەمانەش چەندین جۆریان لێ دەبێتەوە، کە ئێرە جێی باسکردنیان نیە. بۆ زانیاری زیاتر سەیری: (علوم الحديث)، (ابن صلاح الشهرزوری)، دار الفكر، بیروت، ٢٠٠٤، ص: ٩٠ و بەرەو ژوور، بکە.

دارەقوطنی - بە جورئەتەوە قسەیان لەوە کردووە کە لە صەحیحی بوخاری و موسلیمیشدا ڕیوایەتی لاواز هەن و، بۆ ئەو مەبەستە کتێبی (الإلزامات والتتبع)ی دانا.[10] بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا ئەو ڕێبازو شێوازەی کە ئەو جۆرە زانا پایە بەرزانە پەیڕەوییان لێ کرد، لە ڕەخنەگرتن و شرۆڤەکردن و ڕاستکردنەوە، لە ئاستێکدا بوو، کە لەدرێژایی مێژوودا، تا دەگاتە پێشکەوتووترین ڕێبازو میتۆدو مەنهەجە هاوچەرخەکانی سەردەم، مرۆڤایەتی بەخۆیەوە نەیدیوە.

## ٩- بیرۆکەی نەسخبوونی قورئان بە فەرموودە:

هەر ئەو حاڵەتەی سەرەوە لێکەوتەیەکی زۆر مەترسیداری تری هێنایە کایەوە، کە ئەوە بوو هەندێ لە زانایانی ئەو بوارە قسە لەوە بکەن: قورئان بە فەرمودەی صەحیح - هەندێك وتیان بە (موتەواتەر)و، هەندێك وتیان بە (ئاحاد)یش - نەسخ ببێتەوە، گوایە بە نیازی هەڵگرتنی ئەو (تەعاروض)و دژ بەیەکبوونەی کە لە نێوان قورئان و هەندێ ڕیوایەتدا هەبوو، کە زۆرێکیان لەوانەن کە لاوازن، یان ڕیوایەتی ئاحادن.[11] کە ئەمە لەلایەن گەورە زانایانی موحەققیقەوە - بەتایبەتی پێشەوا شافعی یەوە - ڕەد کراوەتەوە. پێشەوا شافعی لە کتێبی (الرسالة)و چەندین کتێبی تریدا، باسی لەم جۆرە نەسخە کردووەو،

---

١ (الإلزامات والتتبع)، دوو کتێبن، لە نوسینی: (الحافظ أبو الحسن، علي بن عمر، الدارقطني)، (ت ٣٨٥ هـ)، کەسێك بەناوی (مقبل بن هادی الوادعی)، لێکۆڵینەوەی لەسەر کردوون و، ساڵی ١٩٨٥، لە (دار الکتب العلمیة)، هەردووکیان پێکەوە لە بەیروت چاپی دووەم کراونەتەوە.

١١ بەداخەوە ئەو بۆچونە، کەوتە ناو مەزهەبە گەورەکانی ئیسلامیش. بۆ نمونە: زانایانی حەنەفی و، ڕیوایەتێك لە مەزهەبی حەنبەلییەوە، پێیان وایە قورئان بە فەرمودە نەسخ بووەتەوە. بەڵام شافعییەکان دژی ئەمەن و، پێیان وایە شتی وا ڕووی نەداوە. لە زانا ناودارەکانیش کە بڕوای بەم جۆرە نەسخە نیە (ابن تیمیە)یە، کە پاش ڕاڤەو شرۆڤەیەکی زۆر دەڵێت: "وبالجملة فلم یثبت أن شیئا من القرآن نُسِخ بسنة بلا قرآن." سەیری: (مجموع فتاوى شیخ الإسلام ابن تیمیة، ٢٠/ ٣٩٧ – ٣٩٩) بکە.

ڕەدی کردۆتەوە. لە (الرسالة)دا بەڕوونیی و پوختی دەڵێت: "أن السنة لا ناسخة للكتاب". واتە: بەدڵنیایی سوننەت نەسخی قورئان ناکاتەوە. لە پەراوێزی (الرسالة)شدا هاتووە: "نص الشافعي في عامة كتبه انه لا يجوز نسخ القرآن بالسنة بحال". واتە: شافعی بە دەق لە هەموو کتێبەکانیدا گوتویەتی: ڕەواو جائز نیە کە سوننەت بەهیچ جۆرێك قورئان نەسخ بکاتەوە." بەڵگەش بەو ئایەتە دێنێتەوە کە دەفەرموێت: (ما يكون لي أن أبدله من تلقاء نفسي).[١٢]

هەرچەند هەندێکی تر لە ژێر شاڵاوی ئەو هێرشەدا کە دەکرایە سەر سوننەت، بڕوایان بەو جۆرە نەسخە ڕاگەیاندووە.

## ١٠- بەرەنگاربونەوەی بیرۆکەکە لەلایەن زانایانەوە:

سەبارەت بەم بیرۆکەیەی ناونراوە (بیرۆکەی ئیکتیفا بەقورئان)- کە جەوهەری پێکهێنەری هزری بەناو قورئانییەکانی کۆن و هاوچەرخە - هەر لە سەدەی دووەمی کۆچییەوە زانا گەورەکان بەرەنگاری بوونەتەوە، لەوانە پێشەوا شافعی (١٥٠- ٢٠٤ ك) لە کتێبێکیدا بەناوی (جماع العلم) باس لەوە دەکات کە خۆی لەگەڵ ژمارەیەك لەو موعتەزیلانە گفت و گۆو مشت و مڕی کردووە کە دژی سوننەت وەستاونەتەوەو، بانگەشەیان کردووە کە فەرموده - و بەگشتیی - سوننەت، نابێتە بەڵگەی شەرعیی و، بەشێك لە سەرچاوەکانی تەشریع.[١٣]

---

١٢ سەیری: (الرسالة، الإمام الشافعي، دار الكتب العلمية، بيروت، ط ٢، ٢٠٠٩، ل: ١٣٢- ١٣٣، بکە). ئەمە لە کاتێکدایە کە زۆربەی مەزهەبەکانی تر لەگەڵ نەسخی قورئان بەسوننەتن، لەگەڵ هەندێك جیاوازیی و وردەکاریی، کە ئێرە جێی باسکردنیان نیە.

٢ سەیری سەرەتای کتێبی (جماع العلم)ی پێشەوا شافعی بکە، کە پاش کتێبی (الرسالة) نوسیویەتی و، تەرخانی کردووە بۆ باسی بنەماکانی بەڵگەهێنانەوەو، بەرگریکردن لە سوننەت. ساڵی ١٩٤٠ لەلایەن عەللامەی فەرمودەناس (ئەحمەد محەممەد شاکر)ەوە لێکۆڵینەوەی بۆ کراوەو، لە ١٣٤ لاپەڕەدا لە لایەن کتێبخانەی (ابن تيميه)وە لە قاهیرە چاپ کراوە. ئەم کتێبە

بەپێی خوێندنەوەی مێژووی ئەو ڕەوتەو، چاوخشاندن بە قۆناغەکانی مێژووی ئوممەتی ئیسلامدا، دەردەکەوێ کە هەڵگرانی ئەم بیرو بۆچوونە هەڵکشان و داکشانی زۆریان بەسەردا هاتووە. بۆ نمونە ئێمە لەبەردەم دەقێکداین کە لە لایەن عەللامە (جلال الدين السيوطى)یەوە - کە ساڵی (٩١١ ك/ ١٥٠٥ ز) وەفاتی کردووە - پێش (٥٠٠) ساڵ نوسراوەو، باس لەم جۆرە بیرکردنەوانە دەکات. دەقەکە بایەخێکی مێژوویی زۆری هەیە، بۆیە لێرەدا وەك خۆی دەیگوێزمەوە. سیوتی دەڵێت:

"بزانن، بەر ڕەحمەتی خوا کەون، لەم سەردەمەی ئێمەدا بۆنی شتێك تەشەنەی کردووە، کە سەردەمانێکە لەناو چووە، ئەویش ئەوەیە کەسی ڕافزی و زندیقی وا پەیدا بووە، کە دەڵێت: سوننەت و فەرمووده بەلگەیان پێ ناهێنرێتەوەو، تەنهاو بەتایبەتی قورئان بەلگەیە... لە ڕاستیدا پێشترو لە سەردەمی چوار پێشەواکەداو، پاش ئەوانیش، زۆرێك لەم جۆرە کەسانە هەبوون، بەڵام چوار پێشەواکەو هاوەڵانیان، لە وانەو گفت و گۆو نوسراوەکانیاندا بە توندیی بەرەنگاریان بوونەتەوە."[١٤]

جگە لەو سەردەمە، لەدمیان سەرچاوەی تری مێژوو دا باس لەهەڵکشانو داکشانی ئەم بیرۆکەو ڕەوتە شێواوە کراوە. بۆ نموونە پێشەوا (شاطبی)یش کە ساڵی (٧٥٠ك) وەفاتی کرووە، دەڵێت: (بیرۆکەی ئیکتفا بە قورئان ڕای خەڵکانێکە هیچ سەرو بنێکیان نیە، ئەوانە لەرێی دروست لایان داوە، واتێگەیشتوون کە قورئان درێژەی هەموو شتی تێدایە، بۆیە ئەحکامی سەرچاوەی سوننەیان خستۆتە لاوە. ئەوانە بەم کارەیان لەبازنەی کۆی موسڵمانان چوونەتە دەرەوەو، بە جۆرێك قورئانیان تەئویل کردووە، کە هەرگیز خوا پێی ڕازی نەبووە)[١٥].

---

کە زۆر پوختو کورتە، لە کۆتایی زۆرێك لەچاپەکانی کتێبی (الأم)دا، بەناوی (كتاب جماع العلم) بڵاو کراوەتەوە.

١٤ لە پێشەکی کتێبی (مفتاح الجنة)ی پێشەوا (سیوطي)دا، لا: ٦.

[١٥] . الموافقات، الشاطبی.، ٩/٤.

## دووەم/ سەرهەڵدانەوەی هاوچەرخی ئەو ڕەوتەو، ڕۆڵی خۆرهەڵاتناسان:

### ١- كاریگەریی دوو فاكتەری زاتی و بابەتیی:

بیرۆكەی (ئیكتیفا بە قورئان)، یان (ڕەدكردنەوەی حوجییەتی سوننەت)، سەرەڕای ئەوەی كە زۆر جار كپ بۆتەوەو، باسی نەماوە، بەڵام ناوبەناویش سەری هەڵداوەتەوەو، بەهۆی دوو فاكتەری زاتی و بابەتییەوە، درێژ بۆتەوە تا ئەم سەردەمە:.

یەكەمیان: بێ ئاگایی، یان تێنەگەیشتن لە هەوڵە بێ وێنەكانی زانایانی فەرمودەو، تێكەڵبوونی ئەم نەزانییە بە هەوەسی ئاسانكردنی ئاین و كەمكردنەوەی ئەحكام و پابەندییە ئاینییەكان.

دووەمیان: دنەدان و دەست بەپشتاهێنانی دوژمنانی ئیسلام بۆ ئەو خاوەن بیرۆكانەو، خەرجكردن لەسەر گەشەدان بەو ڕەوتە، بە تایبەتی لەسەردەمی نوێدا لەسەر هەردوو ئاستی وڵاتانی عەرەبیی و ئاسیایی، بەتایبەتی وڵاتانی ژێردەستەی ئینگلیز، كە شۆڕشی ساڵی ١٨٧٥ی موسڵمانانی هیندستان دژی ئینگلیزی داگیركار، زۆر بێتاقەتی كردبوون.

ئەوەی لە سەردەمی هاوچەرخدا دووپات بووەتەوە ئەوەیە كە لەم پیلانەدا خۆرهەڵاتناسەكان ڕۆڵی سەرەكییان هەبوو، كە هاوكات لەگەڵ هەڵمەتی داگیركاریی زلهێزانی خۆرئاوا بۆ وڵاتانی ئیسلامی، ئەوان لە پشتیانەوە بوون. سەرەتا لەسەر دەستی (ئەحمەد خانی هیندیی) - بە موبارەكەی ئینگلیز- بیرۆكەكە وروژێنرا، دواتر گوزێرایەوە بۆ وڵاتانی تر.

بۆ نمونە: خۆرهەڵاتناسی جولەكەی مەجەری ناسراو (گۆڵد تسیهر) (١٨٥٠ - ١٩٢٠) ساڵی ١٩١٠ لە گەرمەی ملهوڕی داگیركاراندا، كتێبێكی بڵاو كردەوە بەناوی (العقیدة والشریعة في الإسلام)و، تیایدا جەختی كردەوە كە زۆربەی فەرمودە

هەڵبەستراون و، لە پێغەمەرەوە نەهاتوون. بەدوای ئەودا هەندێك نوسەری عەرەبی تووشی ئەو دەردە بوون. بۆ نمونە: ساڵی ١٩٢٨ ئەحمەد ئەمین (فجر الإسلام)ی نووسی و، چەندین لاپەڕەی تەرخان کرد بۆ گومان دروستکردن لەسەر سەرچاوەکانی فەرمودەو، کەسایەتی ئەبو هورەیرەی صەحابی خستە ژێر پرسیارەوە. بەدوایدا مەحمود ئەبو رەییە (أضواء على السنة المحمدية)ی نووسی و، زۆر بەتوندیی دابەزییە سەر ئەبو هورەیرە، کە بووە هۆی گلەیی و گازندەی زانایانی ئەو کاتە.[١٦]

٢- تەشەنەی بیرۆکەکە لەوڵاتی میصر:

پاش جیابوونەوەی پاکستان لە هیندستان، بیرۆکەی قورئانییەکان گوێزرایەوە بۆ پاکستان. لە سەرەتای سەدەی نۆزدەشدا وەك وتمان لە میصر سەری هەڵدایەوە دواتر تەشەنەی کردو، هەندێ زاناو نووسەری ناسراو تێوەگلانو، لە ساڵانی هەشتاکاندا ڕاگەیاندنی ڕژێمی ئەوکاتەی میصر دەستەواژەی (منكروا السنة)ی داهێناو، ساڵی ١٩٨٧ کەوتە دەسگیرکردنی کەسانێکی زۆر بەو ناوەوە، کە کاردانەوەی زۆری لێ کەوتەوە. یەکێك لەوانە

---

[١٦] پاش نوسینی ئەم چەند کتێبە، ژمارەیەك لە زاناو توێژەران، بەشێوەیەکی زانستیی، ڕەدی ئەو نوسەرانەو چەند کەسێکی تریان دایەوە، کە کەوتبوونە سەر خەتی بێبابەخ سەیرکردنی پێگەی سوننەت، لەوانە: عبد الغني عبد الخالق، کە لە سەرەتای چلەکانی سەدەی بیستدا، کتێبێکی بەنرخی نوسی بەناوی (حجية السنة)، هەروەها بەدوای ئەودا مصطفى السباعي، کتێبی (السنة ومكانتها في الشريعة الإسلامية)ی نووسی، چونکە لەو کاتەدا لە قاهیرە بوو. هەروەها: محمد عبد الرزاق حەمزە، کتێبێکی نوسی بەناوی (ظلمات أبي رية أمام أضواء السنة المحمدية)و، (عبد الرحمن المعلمي)یش (أضواء السنة من الزلل والتضليل والمجازفة)ی بڵاو کردەوە. جگە لە چەندین کتێبی تر لە هەمان بواردا.

ماموستای پێشووی زانکۆی ئەزهەر دکتۆر (ئەحمەد صەبری مەنصور) بوو، کە لەو ساڵەدا توێژینەوەیەکی بڵاو کردەوە بەناوی (المسلم العاصي)و، بە توندی دابەزییە سەر زانایانی فەرمودەو، گومانی خستە سەر مێژووی نوسینەوەی فەرمودەو، پشتیوانیی لە زۆرێك لە بیرۆکە کۆنەکانی خەواریج و هەندێك لە موعتەزیلەو، رافیزەو، کەسایەتییە هیندییەکان کرد، کە وروژێنەری ئەو بیرۆکەیە بوون‌و، لەبڕگەی داهاتوودا باسێکیان دەکەین.

٣-هەندێك لە ڕابەرو ناودارانی قورئانییەکان:

ناودارترین بنیاتنەرو ڕەواجدەرانی هاوچەرخی سەرەکیی ئەم بیرۆکەو ڕێبازە ئەمانەن:

ا- ئەحمەد خان کوڕی میر موتتەقی حوسەینی (١٨١٧ - ١٨٩٧). کاتێك موسڵمانانی هیندستان ساڵی ١٨٥٧ زاینی شۆڕشیان دژی ئینگلیز هەڵگیرساند، ئەم ئەحمەدخانە دژی شۆڕشەکە وەستایەوە، بە بەڵگەی ئەوەی کە ئینگلیزەکان (ولی امر)وحوکمڕانن و، ڕەوا نیە دژیان شۆڕش بکرێت. بۆیە ئینگلیزی داگیرکار کردیانە یاریدەدەری قازی دادگای خۆیان‌و، ئەمینی تۆمارەکانی قەڵەمی قەزایی خۆیان، چونکە لەوکاتەدا فەرمانبەری کۆمپانیای هیندی شەرقی ئینگلیزەکان بوو.[١٧]

ناوبراو تەفسیرێکی قورئانی کردووەو، زۆربەی چەمکەکانی شێواندووە، بۆ نمونە: ئینکاری بوونی فریشتەو پەری و شەیتان دەکاو، پێی وایە مەبەست لە فریشتەکان ڕەگەزو توخمەکانی سروشتن، وەك: باو، باران‌و، گڕکان‌و، هتد.

هەروەها بڕوای وایە مەبەست لە جنۆکە لە قورئاندا دانیشتوانی بێشەڵان و ساراکانن‌و، مەبەستیش لە شەیاتین هەواو ئارەزووەکانی دەروونە.

---

[١٧]) سەیری پێگەی ئەلیکترۆنیی (الراصد) بکە.

سەبارەت بە دەقی قورئانیش پێی وایە تەنها واتاکەی دابەزیوە، نەك دەقەکەی، هەرچی فەرمودەی پێغەمبەریش هەیە ﷺ حوجییەتیان نیەو، ئەحکامەکانی ناویان جێی گومانن‌و، پەیڕەوکردنیان واجب نیە.

بۆیە ئینگلیزەکان لەبەر ئەم بۆچوونە چەوتو بێ سەروبەرانەی، خەڵاتیان کردو، مەدالیاو نازناوی (خاوەنی ئەستێرەی هیند)یان پێی بەخشی.

ئەم ترازان و لادانە مەنهەجییە، ئەو کابرایەی گەیاندە ئاستێك کە وازی لە نوێژکردن و ڕۆژووگرتن هێنا.. سەرەنجام ساڵی ١٨٦٢ شەرحی ئینجیلی بڵاو کردەوە.[١٨]

ب- عبد الله کوڕی عبد الله حیَکرالەوی (نیسبەتە بۆ شوێنێك بەناوی (حکرالە) (١٨٣٠-١٩١٤): ئەمیش زۆرێك لەو بۆچوونانەی ئەحمەدخانی هەبوو. کۆمەڵێکی دژ بە فەرمودەی دروست کرد بە ناوی (جماعة أهل الذكر والقرآن)،[١٩] کە ئامانجی سەرەکییان لێدانی فەرمودەو سوننەت بوو.

ج- أحمد الدين ئەمر تەسری (١٨٦١-١٩٣٦): ئەمەیان دۆستی غولام ئەحمەدی قادیانی بوو، کە بۆ بەرەنگاربوونەوەی جیهادی دژی ئینگلیز دروست کران. ئەمیش کۆمەڵەیەکی پێك هێنا بە ناوی (الأمة المسلمة).[٢٠] کە مەبەستیان لەو ناوە ئەندام و لایەنگرانی خۆیانە.

د- غولام ئەحمەد پەروێز، کوڕی فضل الدين (١٩٠٣- ): ئەمیش گۆڤارێکی دەرکرد بە ناوی (طلوع إسلام)و، چەندین وتاری دژی حوجییەتی فەرمودە بڵاو کردەوە. بۆچوونی وابوو کە دەسەڵاتی سیاسی و ڕژێمی حاکم، درێژەی ئەحکامی

---

[١٨] سەیری (شبهات القرآنين حول السنة و النبوية) د. محمود محمد مزروعه، لا: ٢٩ – ٣٢ بکە.

[١٩] هەمان سەرچاوە، لا: ٣٨.

[٢٠] هەمان سەرچاوە، لا: ٤١.

شەرعی دادەنێ‌و، پێویست ناکات لە ڕیوایەت و فەرمودە ئەحکامی شەرعیی وەرگیرێن. ناوبراو بۆ گەیاندنی بۆچونەکانی ژمارەیەك یانەی کردەوە بەناوی (یانەکانی تلوعی اسلام) کە تیایدا ئەو بیروبۆچونانەی بڵاوکردەوە.

هەروەها چەندین کەسی تریشیان هەن وەك: (جەعفەر شا بلواری، محەمەد ڕەمەزان، چراغ عەلی، عناية الله مەشریقی).

هـ – بەناو قورئانییەکان کە خۆیان بە (أهل القرآن) دەناسێنن، لە میصریش چەند کەسێکی دیاریان هەن، لەوانە: د. ئەحمەد صەبری مەنصور، کە پێشتر ناومان برد. سەرەتا مامۆستای زانکۆی ئەزهەر بوو، بەڵام لەبەر ئەوەی دژی فەرمودەو سەرچاوەکانی فەرمودە بوو، لەسەر کار دەرکرا. ناوبراو توێژینەوەیەکی بڵاو کردەوە بەناوی (المسلم العاصي)، کە ئەو بۆچونە دژە سوننەتییانەی تێدا بڵاو کردەوە. دواتر لە ساڵی ٢٠٠٠ چووە ئەمریکاو، ئێستە ناوەندێکی لە ئەمریکا داناوە بەناوی (المركز العالمي للقرآن)، جگە لەوە کە پێگەو پەیجی ئەلیکترۆنیی هەیەو، سوورە لەسەر بڵاوکردنەوەی بیرو بۆچونەکانی.

هەروەها چەند کەسێکی تریان هەن، وەك: ئەمین یوسف عەلی، کە ئەویش لە قاهیرە وتاربێژی مزگەوت بوو، بەڵام دەستگیر کرا. هەروەها عەلی سیسی و، ئیهاب عەبدەو، چەند کەسایەتییەکی تریان، کە لە فەیس بوك و تۆڕە کۆمەڵایەتیەکاندا بیروباوەڕی خۆیان بڵاو دەکەنەوە. لە وڵاتانی تریش چەند پشتیوانێکیان هەیە، وەك: مصطفى مەهدەوی لە لیبیا، محمد طالبي لە تونس، محمد صالح بنور لە جەزائیر، عماد الدين دەبباغ لە سودان[21].

---

[21] ئەمانە هەندێکیان پێگەو سایتی ئەلیکترۆنیی و، هەندێکیان لە تۆڕی کۆمەڵایەتی (فەیسبووك)، پەیجیان هەیە، هەندێکیشیان بە وتارو کتێب بۆچونەکانیان بڵاو دەکەنەوە.

## سێیەم/ هەڵە گەورەکانیان و، وەڵامیان:

### ١- <u>بەڵگەی بێ جێ بە هەندێك ئایەت:</u>

بەدەر لەوەی تاقمێك لەوانەی دژی سوننەت بوون لە سەرەتاوە لەلایەن ئینگلیزو بەکرێگیراوانیەوە دننە دران و، پشتیان گیرا، ئەگونجێ لێرەو لەوێ لە رووی نەزانین و، دوریش نیە هەندێ جار لە رووی دڵسۆزییەوە بۆ ئاین، کەسانێکی تر کەوتبنە بازنەی ئەو هەڵە کوشندەیە، کە: گوایە بۆ وەرگرتنی ئیسلام قورئان کافییەو، پێویست بە پەنابردنە بەر فەرموودە نیە.

ئەم تاقمانە هەندێکیان لە تێگەیشتنێکی نادروستەوە لە چەند ئایەتێکی قورئان کەوتوونەتە ئەو هەڵە گەورەیەوە. بە تایبەتی چەند ئایەتێك کە زۆر دووبارەیان دەکەنەوە. یەکەمیان ئایەتی (٣٨)ی سورەتی (الأنعام) کە دەفەرموێ: ﴿مَا فَرَّطْنَا فِي ٱلْكِتَٰبِ مِن شَيْءٍ﴾، دووەمیان ئایەتی (١١١) سورەتی (یوسف) کە دەفەرموێ: ﴿وَتَفْصِيلَ كُلِّ شَيْءٍ﴾. سێیەمیان ئایەتی (٨٩)ی سورەتی (النحل)ە، کە دەفەرموێ: ﴿ونزلنا عليك الكتاب تبيانا لكل شيئ وهدى ورحمة وبشرى للمسلمين﴾.

بەڵام وەڵامی ئەم بۆچوونە نادروستە، کە لە بەڵگەهێنانەوەی هەڵە بەو سێ ئایەتە، سەرچاوەی گرتووە، ئەمەیە:

یەکەم: مەبەستی قورئان لە ئایەتەکەی سورەتی (الأنعام) ئەوەیە کە لە کتابی خوادا شتێك نیە کە (تفریط) دەرهەقی کرا بێ، واتە گوێی پێ نەدرا بێ. مەبەست لە (کتاب)یش لەوێدا (لوح المحفوظ)ە، نەك قورئان، جگە لەوە ئەگەر

---

دەتوانرێت لەرێی پێگە ئەلیکترۆنییەکان و تۆرە کۆمەڵایەتییەکانەوە، زانیاریی لەسەریان دەست بخرێت.

مەبەست قورئانیش بێت، لەو ئایەتەدا نەگوتراوە: هەرچی شتە باس کراوە، بەڵکو مەبەست ئەومیە بە شێومیەك لە شێوەكان لە قورئاندا یان لە (لوح المحفوظ)دا ئاماژە بۆ هەموو شتێك كراوە. ئەمەش بەم شێوانەی خوارەوە:

١ـ هەندێ بابەتی قورئان پەیوەندییان بە بڕواو ئیمان و فریشتەو دوارۆژو بابەتە سەرەکییە غەیبییەکانەوە هەیە، کە ئەمانە لە قورئاندا بەدرێژیی باس کراون و، خاڵێکی بنەڕەتیی دەربارەیان نەماوە کە پێویستی بە سوننەت هەبێت.

٢ـ هەندێك ئایەتی تر پەیوەندییان بە ئەحکامە شەرعییە بنەڕەتییەکانەوە هەیە، کە ئەمانەش بە پێی پێویست و بەپێی بایەخ و گرنگییان لە قورئاندا وێنا کراون و، بازنەی گشتییان بۆ کێشراوە. پێغەمبەری خواش (درودی خوای لەسەر بێت)، ڕونکردنەوەی لەسەر داون و، ئەوانەی پێویستیان بە شیکردنەوە ببێت، شی کردونەتەوە. هەندێك جار ئایەت بە پوختت و (موجمەل)ی باسی حوکمێکی کردووە، پێغەمبەری خوا (تەفصیل)ی داوەتێ هەندێك جار گشتیی و (عام)ە، ئەو (تەخصیص)ی کردووە.[٢٢] هەرچەند لەسەر ئەم دەسەڵاتە هەندێك ڕای جیاواز هەیە.

٣ـ دەمێنێتەوە هەندێك بابەت کە پەیوەندییان بە بەها ڕەوشتییەکان و هەڵس و کەوت و مامەڵەی مرۆڤەکان و، بنەماکانی سیستمی سیاسی و کۆمەڵایەتی و ئابورییەوە هەیە، کە خوای بەتواناو کاربەجێ بەپێویستی نەزانیوە درێژەی چۆنیەتییەکانی لە قورئاندا باس بکات و، تەنها بە پوختی و (مۆجمەل)ی باسی کردوون. ئەمەش لەبەر دوو هۆ:

---

٢٢ ئەم دەستەواژانە: (مجمل) و (مفصل)، (عام) و (خاص)، لەگەڵ هەندێکی تری وەك: (مطلق) و (مقید) زاراوەی زانستین و، لە زانستی (أصول الفقه)دا بە درێژیی ڕوون کراونەتەوە. خوێنەر دەتوانێت لە هەر سەرچاوەیەکی تایبەت بەو زانستەدا زانیاریی زیاتریان لەسەر وەربگرێت.

ا ـ ئەگەر هەموو ئەو وردەکارییانە لە قورئاندا باس بکرانایە، دەبوایە قورئان صەدان بەرگی گەورە بوایەو، قەبارەی قورئان دەبووە صەدان بەرابەری قەبارەی ئێستەی، کە ئەمەش لە سەرێکەوە دوورە لە حیکمەت و، لە سەرێکی تریشەوە تێگەیشتن و دابەزاندنی پرەنسیبە قورئانییەکانیش لە توانای مرۆڤ - بەپێغەمبەری خواشەوە — دەردەچوو.

ب ـــ هەروەها بەدرێژکردنەوەی قورئان بۆ هەموو حوکمەکان، پانتاییەك نەدەمایەوە بۆ ڕێزگرتن لە عەقڵی مرۆڤ و، جیاوازیی هەل و مەرج و ژینگەو کۆمەڵگەکان و، ئەو گەشەکردن و ئاڵ و گۆڕە سروشتییەی کە بەسەر هزرو ژیریی مرۆڤایەتیدا دێت و، پێویستی بە ئاڵ و گۆڕی هەندێ فتوا هەیە، لەناو بازنە فراوانەکەی بۆچونی قورئانیدا.

٤ ـ هەندێك لە بابەت و ڕاستییە قورئانییەکان تەنها ئاماژەیان بۆ کراوەو، بە شێوەی ڕێساو بنەمای گشتیی (قواعد)و (ضوابط) باس کراون. کە دەبنە ئامرازو سەرچاوەی دەستی زانایانی موجتەهیدی سەردەم و ژینگە جیاجیاکان، بۆ دەرهێنانی حوکمی شەرعیی نوێ، بە پێی داخوازییە ژیاریی و شارستانییە جیاوازەکان. کە ئەمەش لە ئایەتی (أطیعوا الله وأطیعوا الرسول وأولوا الأمر منکم) بە ڕوونی فەرمانی پێ دراوەو، گوێڕایەڵیی خاوەنفەرمانان و سەرکردایەتی شەرعیی موسڵمانان لە پاش گوێڕایەڵیی خواو پێغەمبەری خوا باس کراوە.

(لەبەر گرنگیی ئەم بابەتە لە خاڵێکی تایبەتدا دەگەڕێمەوە سەری).

دووەم: وشەی ﴿وَتَفْصِيلَ كُلِّ شَيْءٍ﴾ لە ئایەتی سورەتی (یوسف)دا، هەرگیز بە واتای ئەوە نایەت کە بە درێژیی هەرچی شتە لە قورئاندا باس کراوە. ئەو ئایەتە لە ئاقاری باسی بەسەرهاتی یوسف (علیه السلام)و براکانیدایە، سەرەتای ئایەتەکە دەفەرموێ: ﴿ لَقَدْ كَانَ فِي قَصَصِهِمْ عِبْرَةٌ لِّأُوْلِي

ٱلۡأَلۡبَٰبِ﴾ کەواتە ئاماژەیە بەوە کە لە ژیان و بەسەرهاتی ئەواندا پەندو وانە هەیە. پاشان دەفەرموێ ﴿مَا كَانَ حَدِيثٗا يُفۡتَرَىٰ﴾ واتە: ئەم قورئانە، یان بەسەرهاتی یوسف و براکانی، هەڵبەستراو نیە، ﴿وَلَٰكِن تَصۡدِيقَ ٱلَّذِي بَيۡنَ يَدَيۡهِ﴾ بەڵکو بەڕاستدانانی ئەوەیە کە لە پێش قورئاندا هاتووە لە کتێبە ئاسمانییەکان، کە باسی یوسفیان تێدایە، بەتایبەتی ئاماژەیە بە تەورات. پاش ئەوە دەفەرموێ: ﴿وَتَفۡصِيلَ كُلِّ شَيۡءٖ﴾، مەبەست ئەوەیە کە درێژەی داوە بە بەسەرهاتی یوسف (علیه السلام)، یان لە هەر شتێك کە پەیوەندیی بە هیدایەتی مرۆڤەکانەوە هەبێت، شتێکی فەرمووە، یان ئاماژەی پێکردووە. واتە: ئەو ڕستەیە نابێت لەو سیاقە دەربهێنرێت و، بکرێتە بەڵگەی ئەوە کە قورئان درێژەی بە هەموو شتێك داوە.

سێیەم: بە نیسبەت ئایەتی (٨٩)ی سورەتی (النحل)ەوە، کە دەفەرموێ: ﴿ونزلنا عليك الكتاب تبيانا لكل شيئ وهدى ورحمة وبشرى للمسلمين﴾، زۆر ڕوونە کە مەبەست ئەوە نیە کە قورئان هەموو شتێکی تێدایە، چونکە بە واقیعیی وا نیەو، دەبینین کە قورئان زۆر شتی تێدا نیە، شتی پەیوەندیدار بە ئاینیشەوە، نەك هەر بە ڕەهایی شتی تر. بۆ نمونە: لە ئەحکامی نوێژدا ژمارەی ڕکات و، خوێندنی قورئان تیایانداو، کاتەکانی نوێژ- کە هەموو ڕوکن و پایەی گرنگی نوێژن- لە قورئاندا باس نەکراوە. یان لە باسی بڕو ڕێژەو چۆنیەتی دەرکردنی زەکات - کە پایەیەکی تری ئیسلامە - قورئان هیچی ڕوون نەکردۆتەوە. ئەی کەواتە (تبيانا لكل شيئ) یانی چی؟

تێکڕای زانایانی تەفسیر لە (صەحابەو تابعین)ەوە تا هاوچەرخەکان، یەکدەنگن لەسەر ئەوەی کە مەبەست ئەوەیە کە قورئان هەموو شتێکی گشتیی (کلیات) تێدایە لەو بابەتانەی کە بۆ تێگەیشتن لە ئاین و پەیڕەویی ئەحکام پێویستن، بەو شێوەیەی کە لە بڕگەی یەکەمی سەرەوەدا دابەشمان کردو،

ڕوونمان کردەوە. واتە: هەندێکی قورئان بەدرێژیی ڕوونی کردۆتەوە. هەندێکی بە کورتی ئاماژەی پێ کردووە. هەندێکی ڕێساو قەواعیدی گشتیی بۆ داناوە. هەندێکی سپاردووە بە پێغەمبەری خوا کە ڕوونی بکاتەوە.. وەهەروەها.

## چوارەم/ بەڵگەکانی قورئان لەسەر بەڵگەبوونی سوننەت:

بابەتی حوجییەتی سوننەت و، پێویستیی فەرمودەو بەگشتیی سوننەت وەك سەرچاوەی دووەمی دەرهێنانی ئەحکام، بابەتێکە کە لە چەندین ئایەتی خودی قورئانی پیرۆزدا ئاماژەی بۆ کراوە. لە چەندین ئایەتدا لە پاڵ گوێڕایەڵیی خوای گەورەدا باس لە گوێڕایەڵیی پێغەمبەریش کراوە، یان باس لە ئەرکی پێغەمبەری خوا ﷺ لە ڕونکردنەوەی قورئاندا کراوە. کە ئەوە دەری دەخات جگە لە قورئان شتێکی تر دەبێ هەبێت کە بریتییە لە ڕونکردنەوکانی پێغەمبەر ﷺ. لەم بڕگانەی خوارەوەدا ئاماژە بە بەشێك لەو ئایەتانە دەکەین:

١- لە قورئاندا ئاماژەی ڕۆشن کراوە کە پاش ناردنی قورئان لەلایەن خواوە ئەرکێکی تایبەت لەسەر پێغەمبەرە ﷺ، کە بریتیە لە ڕوونکردنەوەی قورئان. ئەوەتا دەفەرموێ: ﴿وَأَنزَلْنَآ إِلَيْكَ ٱلذِّكْرَ لِتُبَيِّنَ لِلنَّاسِ مَا نُزِّلَ إِلَيْهِمْ﴾ (النحل/٤٤)، واتە: قورئانمان ناردووەتە خوارەوە بۆ تۆ، تا ئەوەی نێرراوە بۆ خەڵکی ڕوون بکەیتەوە.

جا ئەگەر بڕیار بێ ڕوونکردنەوەی پێغەمبەر ﷺ بۆ سەراسەری مرۆڤایەتی بێ، بە تان و پۆی زەمین و زەماندا، ئەوە دەبێ شتێك لەبەردەستی نەوەکانی دوای صەحابە هەبێ بە ناوی (ڕوونکردنەوەکانی پێغەمبەر) کە بریتین لە هەمان ئەو فەرموودە ڕاست و دروستانەی کە لە (صحاح)و (سنن)و (مسانید)دا پارێزراون. دیارە ئەمە مانای ئەوە نیە ئەو کتێبانە ڕیوایەتی لاوازو هەڵبەستراویان تێدا نیە، بەڵکو باس لەوەیە بەپێی ئەو ئایەتەو چەندین ئایەتی

تـــر دەبـــێ شـــتێك لەبەردەســـتی ئوممـــەتی ئیســـلامیدا بێـــت بـــە نـــاوی (ڕونکردنەوەکانی پێغەمبەرﷺ).!

٢- تەنانــەت ئایـەت هەیـە ئـەوە دەگەیـەنێ کـە ئەگـەر پێغەمبــەر ﷺ ڕوونکردنەوەی پێویست نەدا لەسەر هەنـدێ لـە ئایەتـەکانی قورئـان، ئـەوە ڕاقەو ماناکردنی لەلایەن موسڵمانانەوە جیـاواز دەبێ و چـەند قسـەیی تـێ دەکـەوێ. ئــەوەتا دەفــەرموێ: ﴿ وَمَآ أَنزَلْنَا عَلَيْكَ ٱلْكِتَـٰبَ إِلَّا لِتُبَيِّنَ لَهُمُ ٱلَّذِى ٱخْتَلَفُواْ فِيهِ ﴾ (النحل/٦٤).

٣- لە قورئـانی پیرۆزدا چـەندین ئایـەت هـەن کـە گوێڕایـەڵیی خـوای گـەورەو، گوێڕایــەڵیی پێغەمبــەری خــوای، بــە دوای یــەکتردا هێنــاوە، وەك دەفــەرموێ: ﴿أَطِيعُواْ ٱللَّهَ وَأَطِيعُواْ ٱلرَّسُولَ وَلَا تُبْطِلُوٓاْ أَعْمَـٰلَكُمْ ﴾ (محمـد/٣٣)، واتــە: فەرمانبــەردارو گوێڕایــەڵی خــوا بــن و، گوێڕایــەڵی پێغەمبــەریش بــن ﷺ، کـارو کردەوەکانتــان پوچەڵ مەکەنەوە. جا ئەگەر گوێڕایەڵیی خوا بریتی بێ لـە پـەیڕەویی قورئـانی پـیرۆز، ئـەی گوێڕایــەڵی پێغەمبــەر ﷺ دەبـێ چـی بـێ جگـە لـە پـەیڕەویی فەرمودەو ژیاننامەکەی؟!.

لەم بارەیـەوە چـەندین ئایـەتی تـر هـەن، وەك ﴿ قُلْ أَطِيعُواْ ٱللَّهَ وَٱلرَّسُولَ ﴾ (آل عمـران/٣٢). ﴿وَأَطِيعُواْ ٱللَّهَ وَٱلرَّسُولَ لَعَلَّكُمْ تُرْحَمُونَ ﴾ (آل عمـران/١٣٢). ﴿ وَأَطِيعُواْ ٱللَّهَ وَأَطِيعُواْ ٱلرَّسُولَ وَٱحْذَرُواْ ﴾ (المائدة/٩٢). ﴿وَأَطِيعُواْ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥٓ إِن كُنتُم مُّؤْمِنِينَ ﴾ (الأنفال/١).

٤- قورئانی پیرۆز لە هەندێ ئایەتـدا بـە ڕوونـی ڕۆڵـی تـەواوکاریی پێغەمبـەر ﷺ لە تەشریعدا دوپات دەکاتەوە. بۆ نمونە: قورئان لە زەمکردنـی یـەهودو بـێ

بڕواکانی ئەو سەردەمەی پێغەمبەردا فەرمویەتی: ﴿وَلَا يُحَرِّمُونَ مَا حَرَّمَ اللَّهُ وَرَسُولُهُ﴾ (التوبة/٢٩). ئەمە دەری دەخا کە پێغەمبەری خواش بە تێگەیشتنی وردی لە قورئان، دەبێ حوکمی حەرامکردنی هەندێ شتی دابێ، کە دەبێت مرۆڤی موسڵمان پابەندیان بێت. ئەمە هەمان ئەو ڕاستییەیە کە لە ئایەتی تردا جەختی لەسەر کراوەتەوە. بۆ نمونە لە وەصفی پێغەمبەردا ﷺ دەفەرموێ: ﴿يَأْمُرُهُم بِالْمَعْرُوفِ وَيَنْهَاهُمْ عَنِ الْمُنكَرِ وَيُحِلُّ لَهُمُ الطَّيِّبَاتِ وَيُحَرِّمُ عَلَيْهِمُ الْخَبَائِثَ وَيَضَعُ عَنْهُمْ إِصْرَهُمْ وَالْأَغْلَالَ الَّتِي كَانَتْ عَلَيْهِمْ﴾ (الأعراف/١٥٧)، واتە: فەرمانیان پێ دەدا بە کارە پەسەندو چاکەکان، قەدەغەی کارە خراپ و ناپەسەندەکانیان لێ دەکات، هەروەها شتە خاوێن و پاکەکانیان بۆ حەڵاڵ و ڕەوا دەکات، شتە پیس و بێ سودەکانیان لێ حەرام دەکات، ئەو کۆت و بەندانەش کە پێشتر لەسەریان بووە، لەسەریان لا دەبات.[٢٣]

هەرگیز سیاقی قورئانیی و لۆژیکی عەقڵیی ڕێ نادات کە بگوترێ: مەبەست لەمانە هەر خوێندنەوەی خودی ئایەتەکانی قورئانە لەلایەن پێغەمبەرە، وەك گروپە بەناو قورئانییەکان دەیڵێن، ئەگەر وا بوایە پێویست نەبوو، چونکە قورئانەکە بە پارێزراویی لەبەردەستی موسڵماناندایە. چ پێویست دەکات قورئان خۆی ئاماژە بە دوپاتکردنەوەی حوججییەتی خۆی بکات.؟!.

---

٢٣ یەکەم کەس لە زانایانی سەدەی دووی کۆچیی کە بە دوور و درێژی قسەی لەسەر ئەم بابەتە کردبێت، پێشەوا (شافعی)یە، کە لە کتێبی (الرسالة)یدا دەیان ئایەتی کردۆتە بەڵگە لەسەر حوجییەتی سوننە. کتێبی ناوبراو یەکەم کتێبی نوسراوە لە زانستی (أصول الفقه)و، لەڕاستیشدا یەکێکە لە سەرچاوە هەرە زانستییە دێرینەکان.

**پێنجەم/ جگە قورئان و سوننەت، گوێڕایەڵی (أولوا الأمر)یش هەیە:**

زیاد لەوەی بەناو (قورئانییەکان) دەیڵێن کە قورئانمان بەسەو، پێویستیمان بە فەرمودە نیە، ئایەت هەیە لە قورئاندا کە دوپاتی دەکاتەوە دەبێ جگە لەقورئان و فەرمودە سەرچاوەیەکی تر هەبێ بۆ موسڵمانان، کە ببێتە مایەی گەشەی فیقهی ئیسلامیی‌و دامەزراوە تەشریعییەکان‌و، نیشانەی زیندویەتیی‌و واقعیەتی فیکرو فیقهی ئیسلامیی، ئەویش بریتییە لە ئیجتیهادو تێگەیشتنی ئەهلی ڕەئی‌و خاوەن فەرمان و موجتەهیدەکان لەسەردەمە جیاجیاکاندا، کە قورئان ناوی ناون (أولوا الأمر). ئەمەش نهێنی مانەوەی ئیسلام‌و سازگاربوون‌و گونجانی شەریعەتەکەیەتی، لەگەڵ هەموو سەردەم و ژینگەو کۆمەڵگەکانی مرۆڤایەتی لەدرێژایی مێژوودا. هەروەها هۆکاری قوتارکردنی شەریعەتی ئیسلامە لەچەقبەستوویی‌و، داتەکاندنی تەپ و تۆزی کۆمەڵگەو ژینگە جیاجیان و، پیاچوونەوەی ئەو ڕاو بۆچوون و ئیجتیهادو فتوایانەی بەسەرچوون‌و پێویستان بە گۆڕین هەیە.

لەم بارەیەوە خوای گەورە دەفەرموێ:﴿أَطِيعُواْ ٱللَّهَ وَأَطِيعُواْ ٱلرَّسُولَ وَأُوْلِي ٱلْأَمْرِ مِنكُمْ ﴾(النساء/٥٩). دیارە گوێڕایەڵیی خوای گەورە بە پەیڕەویکردنی قورئان دەبێ و، گوێڕایەڵی پێغەمبەریش بە پێڕەویی ژیاننامەکەیەتی‌و، گوێڕایەڵی خاوەن فەرمانانی موسڵمانانیش، بە پابەندییە بەو بۆچوون و ئیجتیهادو بڕیارانەوە کە لە سەردەمە جیاجیاکاندا، بەپێی گۆڕانکارییەکان دەیدەن، لەژینگەو شوێن‌و هەل‌و مەرجە جیاجیاکاندا، کە تا ئێستە بریتیە لەو ئیجتیهادو بۆچون و فتوایانەی لە سەدە ڕابردووەکاندا گەڵاڵە بوون‌و، مەنزومەی (فیقهی ئیسلامی)یان پێك هێناوە.

لێرەدا زۆر پێویستە ئەوە بزانین کە دەگرێ - بگرە دەبێ - ئەو ئیجتیهادو بۆچوون و فتوایانە، بگۆڕێنو، تەنانەت هەندێ جار پێچەوانەیش ببنەوە، چونکە بۆ سەردەمی خۆیان حوجەت و بەڵگە بوونو، مەرج نیە بۆ هەموو کات و شوێنەکان حوجبییەتیان بمێنێ.

**کتاب و حیکمەت پێکەوەن:**

خاڵێکی تری گرنگ ئەوەیە کە ئایا مەبەست لە (حیکمەت) لە قورئاندا چیە، کە لە چەندین ئایەتدا لە پاڵ (کتاب)دا ئەرکی فێرکردنی سپێرراوە بە پێغەمبەر ﷺ؟ بۆ نمونە: خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿ كَمَآ أَرْسَلْنَا فِيكُمْ رَسُولًا مِّنكُمْ يَتْلُواْ عَلَيْكُمْ ءَايَٰتِنَا وَيُزَكِّيكُمْ وَيُعَلِّمُكُمُ ٱلْكِتَٰبَ وَٱلْحِكْمَةَ وَيُعَلِّمُكُم مَّا لَمْ تَكُونُواْ تَعْلَمُونَ ﴾ (البقرە/١٥١). لێرەدا کاتێك باسی خوێندنەوەی ئایەتەکان کراوە، ئەی مەبەست لە فێرکردنی (حکمة) لە پاڵ (کتاب)دا چیە، ئەگەر شتێکی جیاواز نیە لە قورئان، کە هەمان ژیاننامەو سوننەتی پێغەمبەرە ﷺ، لەگەڵ ئەو شتانەی کە لەگەڵ ڕاستییەکانی قورئان و سوننەتی صەحیحدا یەك دەگرنەوە؟ ئەم دەستەواژەی (کتاب)و (حکمة)یە لە پاڵ یەکتردا لە چەندین شوێنی قورئاندا دوپات کراوەتەوە، وەك: (آل عمران/٦٤)، (الجمعة/٢)، (البقرة/٢٣١)، (النساء/١١٣)، (الأحزاب/٣٤).

**سەشەم/ بەشێک بەبۆچوونە هەڵەکانیان:**

ئـەم تاقمانــە ســەبارەت بــەزۆرێك لــە بابەتــە فكرییــەكان و ئەحكامــە شەرعییەكان قسەی خۆیان هەیە. لێرەدا بەشێوەی پێرست ئاماژەیان پێ دەکەم، پێم وایە ئەم بابەتانەی خوارەوە پێویست بە وەڵامدانەوە ناكەن، چونكە زۆرێك لەو خاڵانە كە ئەوان بڕوایان پێان هەیە لەڕاستییە ئیسلامییە چەسپاوەكانن و، بەلگــە نەویســتن. وەڵامیشــیان بوێــت لێــرەدا نــاگونجێ بیاننوســین، چــونكە هەركامیان بەلای كەم وتارێك یان توێژینەوەیەكی پێویستە. بۆ نمونە:

- بڕوایان بە هیچ موعجیزەیەكی پێغەمبەران نیە.
- هەموو جۆرەكانی شەفاعەت ڕەد دەكەنەوە.
- بڕوایــان بــە مولكــدارێتی تاكەكەســیی نیــە، لەســەر مەزهــەبی كۆنــە كۆمۆنیستەكانی سەرەتاو ناوەڕاستی سەدەی بیست.
- بڕوایان بەو جۆرە بەهەشت و دۆزەخە نیە كە لە فەرمودەدا ڕوون كراونەتەوە.
- بڕوایان بە شەیتان و جنۆكەو فریشتەكان نیە.

بە كورتی بنەما فكرییەكەیان لە دوو خاڵدایە:

یەكەم: هەموو ئەو بۆچوونە فكریی و حوكمە شەرعییانە ڕەد دەكەنــەوە كـە لـە سونەتدا ئاماژەیان پێ كراوە.

دووەم: هــەروەها تــەئویلی زۆرێــك لــەو ئایەتانــە دەكــەن كــە لــە ڕێــی فــەرمودەوە ڕوون كراونەتەوە. واتە (تــەبیین)ی پێغەمبــەریان قبــوڵ نیــە. بۆیــە لــەم باســەدا زیاتر تیشكمان خستە سەر ئەو دوو خاڵە، كە پایەی سەرەكی بیركردنەوەیانە.

هەر لێرە شـەوە دەكـرێ لـە ڕادەی لادان و دووركەوتنـەوەی ئـەو تاقمانـە لـە ڕاســتەڕێی ئیســلام تــێ بگــەین. هــەروەها لــە ڕادەی مەترســیی ئــەو جــۆرە بیركردنەوەیەو ئەو شێوە تێگەیشتنە چەوتە لە ئیسلام، دڵنیا ببینــەوەو، دەركی پێویستیی بەرەنگاربونەوەشیان بكەین.

بــەڵام ئــەم كــارە دەبێــت بەشــێوەیەكی زانستییانە ئــەنجام بــدرێت، دوور لــە دەمارگیریی و پەڕگیریی و، دوور لە تێكەڵكردنی باسی ئەمانە لەگەڵ باسی ئــەو زانــاو بیرمەنــدە دڵسۆزانەی ئوممــەتی ئیســلامیی، كــە لــە هــەموو ســەردەمێكدا هەبوون - بە سەردەمی خۆشمانەوە - كە كەم و زۆر ئەم باسانەیان وروژانــدووەو، دڵسۆزانە بۆ چارەسەر گەڕاون، وەك لەسەرەتاوە ئاماژەمان پێكرد.

## حەوتەم/ کورتەیەك لەچۆنیەتی مامەڵە لەگەڵ سوونەتی پێغەمبەری خوا

لەچەند خاڵێکدا دروسترین ڕێگای مامەڵە لەگەڵ سوونەت ڕوون دەکەینەوە:

**١. پێناسی فەرموودەو سوونەت:**

**فەرموودە:** دیارە مەبەست ئەو گوفتارانەن کە لەپێغەمبەری خواوە دەرچوون بە مەرجێك سەلمێنراو بێت کە گوفتاری ئەون.

**سوننەت:** فراوانترە لەفەرموودە چونکە کردارەکانیشی دەگرێتەوە، لەگەڵ ئەو گوفتارو کردارانەی کە هی کەسانی تر بوون، بەڵام ئەو دانی پێدا ناون و پەسەندی کردوون.

**سیرەت:** لەسوننەت فراوانترەو، ئەوشتانەش دەگرێتەوە کە باسی خەڵکانی ترە لەبارەی پێغەمبەرەوە (ﷺ).

**٢. تێگەیشتن لەپێگەی فەرموودە، یان سوننەت:**

ئەم بابەتە لەڕێزمانەوە مشتو مڕی زۆری لەسەرە. ئەوەشە وایکردووە کە ڕەوتی جۆراوجۆر دورست ببێ، کە بەندە لێرەدا لەسێ ڕەوتدا کورتیان دەکەمەوە:

**یەکەم:** ڕەوتێك کە ئەو دەستەیەن لەم نامیلکەیەدا ئاماژەمان پێکردنو، بە تەواوی سوننەت ڕەدەکەنەوەو، بە سەرچاوەی شەریعەتی نازانن.

**دووەم:** ڕەوتێك کە لەدژایەتی ئەوانەدا زیادەڕەوی دەکەنو، لەگێڕانەوەی فەرموودەدا دەست شل دەکەنو، گوێ بە مەرجی دروستیو نادروستی نادەن، بگرە گوێ بەوەش نادەن کە لەگەڵ قورئان بەراوردی بکەن.

بەداخەوە ئەم ڕەوتە لەمێژووی ئیسلامیدا زۆرجار زاڵبوونو گەیشتوونەتە ئاستێك کە وتویانە: (قورئان بە سوننەت نەسخ دەبێتەوە).

سێیەم: ڕەوتێکی دروستە، کە ئێمە دەبێ پەیڕەوی بکەین، ئەویش بەم جۆرەیە: فەرموودەو بەگشتی (سوننەت) سەرچاوەی دووەمە بۆ تێگەیشتن لەهەندی لەدرێژەی حوکمەکان، پاش قورئانی پیرۆز، بە مەرجێك جگە لەدڵنیا بوونەوە لەدروستیو نادروستی سەنەدی فەرموودە، لەڕووی مەتنو دەقەکەشیەوە دڵنیابونەوە دروست بوو بێ.

ئەمەش بابەتێکی دوورو درێژەو کورتەکەی ئەمەیە:

١. لەدرێژەی بابەتی ئیمانو بیرو بڕواو پاشەڕۆژدا قورئان ئایەتی زۆری تەرخان کردووەو پێویست ناکات پەنا ببرێتە بەر فەرموودەی (ئاحاد).

٢. پوختەی (احکام)و (اخلاق)یش لەقورئاندا باسکراونو، دەکری بۆ زیادە ڕوونکردنەوە سوود لەفەرموودەی دروست وەربگیرێت.

٣. زۆربەی زانایانی موحەقیق جەختیان کردۆتەوە لەسەر ئەوە کە فەرموودەی (ئاحاد) زانیاریو عیلمی یەقین ناگەیەننو گومان دەگەیەنن، بۆیە پێویست ناکات بکرێنە سەرچاوەی بابەتی گرنگی بیروباوەڕو ئەحکام.

٤. لەوەرگرتنی هەر فەرموودەیەکدا هەوڵبدەین ئەصڵێکی لەقورئاندا بدۆزینەوە بۆ پشتڕاست کردنەوە.

## ٣. ج جۆرێکی (سوننەت) ئەچینە خانەی بەڵگەی شەرعی؟:

دیاره لە(فەرمووده)دا- واته ئەو بەشەی کە گوفتارە- چوار مەرج گرنگن:

أ. دەبێ پێوەری زانایانی متمانەپێکراوی فەرموودەناس (صحیح) یان (حسن) بێت و، نەچێتە خانەی (موضوع)و (ضعیف). واتە مەرجەکانی هەردوو لایەنی (مەتن و) (سەنەد) بێنەجێ.

ب. دەبێ دژایەتی لەگەڵ واتاو مەدلولی ئایەتێکی (قطعي الدلالە)ی قورئان نەبێت.

ج. دەبێ دژایەتی لەگەڵ ڕێسای گشتی (قواعد)و (ظوابط)ی هەڵێنجراو لەقورئان نەبێت.

د. دەبێ بە قەرینەو نیشانەی سیاقدا دەرکەوێت کە ئەو فەرموودەیە وەك (پێغەمبەرێکی ڕەسوڵ) فەرموویەتی، نەك بە ئیعتباری تری قازیەتی،، یان عادەتی شەخصی. (ئەمە مەرجێکی هەستیارەو ڕەچاونەکردنی ئەم خاڵەیە کە خەڵکێکی زۆری بە هەڵەدا بردووەو، بە تاکە فەرموودیەك فتوای ناڕەوا دەردەکەن).

لە(سوونەت) (سیرەت)یشدا هەمان ئەو مەرجانە دووبارە دەبنەوە.

## ٤. چۆنیەتی مامەڵەی دروست لەگەڵ فەرموودەو بەگشتی لەگەڵ (سوننەت):

١ سەرەتا دڵنیابوونەوە لەو خاڵانەی سەرەوە.

٢ پاشان ئاگاداربوون لەبنەما سەرەکیەکانی زانستو فەرموودە (علوم الحدیث)، بەتایبەتی لەجیاکردنەوەی (صحیح) لە (ضعیف)و (آحاد) لە (متواتر)و..هتد.

٣ لەسەر ئەو بنەمایەی سەرەوە نابێت فتوا بە تاکە فەرمودەیەك بدرێت، بەڵکو دەبێ بۆ دەرهێنانی حوکمێك کۆی ئەو فەرموودانە کۆبکرێنەوە کە پەیوەندیدارن بە بابەتێکەوە، پاشان لەکۆی هەموویان تێگەیشتنی دروست پەیدا دەبێ.

٤ نابێ پەنا ببرێتە بەر تەئویلو چەماندنەوەی نا زانستی واتاو مەدلولی فەرموودە واتە: بەپێی رێساکانی زمانی عەرەبی واتا بکرێت.

٥ دەبێ گرنگی بە تێگەیشتنی (مەقاصدی) بدرێت، واتە دوورکەوتنەوە لەماناکردنی (حەرفی)و (ظاهری)و، فەرامۆشکردنی لایەنی حیکمەتو فەلسەفەی حوکمەکان کە لەفەرموودە دەر دەهێنرێن.

٦- ئاشنایی بەرێسا گشتیەکانی زانستی (أصول الفقه)، بەتایبەتی باسەکانی (مطلق)و (مقید)و (عام) و (خاص)و (مجمل)و (مفصل)و..هتد چونکە بێ ئاشنایی بەو باسانە تێگەیشتن لەفەرموودە زەحمەتە.

٧- بۆیە واباشترە کەسانێك کە (فەقیە) نینو، بەو زانستانە ئاشنا نین خۆیان لەو جۆرە فەرمودانە نەدەن کە حوکمیان تێدایەو، زیاتر بایەخ بەو فەرمودانە بدەن کە پەیوەندییان بە ئامۆژگاریو رێنمویی و (وعظ)و (ارشاد)ەوە هەیە.

## ٥. هەندێك لەزانیاری لەسەرچاوەكانی فەرموودە:

چەندین جۆر سەرچاوە بۆ فەرمودە هەن، جیاکردنەوەو تێگەیشتنی پێگەیان، پێویستە، لەوانە:

١. (الصحاح): كە صەحیحی بوخاریو صەحیحی موسلیم مەشهورترینیانە. كە خاوەنەكانیان بە مەرجیان گرتووە دەبێ ئەو ڕیوایەتەی دایدەنێن (صحیح) بێت. ئەڵبەتە هەركامیان بۆ خۆیان بۆ دروستیی فەرموودە مەرجی خۆیان هەیە.

٢. (السنن): ئەوانەن كە كراونەتە چەند باسێك لەسەر بنەمای بابەتە فیقهیەكان (كتاب الطهارة)، (كتاب الصلاة)، (كتاب الزكاة)..وە هەروەها، وەكو: سنن الترمزیو النسائی سنن ابي داود.. ئەمانە بە مەرجیان نەگرتووە، هەموو ڕیوایەتەكانیان (صحیح) یان (حسن)بن، واتە: لاوازیشیان تێدایە، كە خۆیان لەكۆتایی ڕیوایەتەكەدا ئاماژەیان پێكردووە.

٣- (المسانید): ئەوانەن سەنەدیان تێدایە تا سەر صەحابە، بەشێوەی (باب)و (قسم)و (مسانید) هاتوو، وەك موسنەدی ئەحمەد كە (٣٠) هەزار ڕیوایەتی تێدایە.

٤- (المعاجم)یش هەن، وەك (المعجم الكبیر)ی تەبەرانی (ت: ٣٦٠ھ)، كە بەپێی تەرتیبی صەحابە كۆكراونەتەوەو مەرجی (صحیح) بوونیان لەگەڵ نییە.

٥- پاش ئەوانە (المصنفات)یش هەن، كە بەشێوەی بابەتن، وەك: (مصنف عبدالرزاق)و مصنف ابن ابی شیبە، لەنێوان ساڵانی (١٥٠) بۆ (٢٥٠)ی كۆچی دانراون.

## ٦. پۆلێنی فەرمووده لای زانایان:

١. کۆی زانایانی فەرموودەناس‌و (اصولی)یەکان، فەرمووده دەکەنە دووبەش:

أ. (متواتر): کە ئەویش دوو جۆرە: (قولی)و (معنوی).

ئەمجۆرە لای جمهوری زانایان سەلمێنراوەو حوکمی پێ دەکرێت (ئەم جۆرە ئەو جۆرە فەرمودانە دەگرێتەوە کە کەسانێکی زۆر دەیگێڕنەوە کە لەڕووی عەقڵی-یەوە کۆبوونەوەیان لەسەر درۆکردن ئەستەمە).

ب. (آحاد): ئەو جۆرەیە کە کەسێك یان دوو یان زیاتر دەیگێڕنەوە، بەڵام ناگەنە ئاستی (متواتر).

ئەمەش- لای جمهوری زانایان — سێ جۆرە: (مشهور، عزیز، غریب).

لای زۆربەی زانایان ئەم جۆرە بە هەر سێ بەشەکەیەوە دڵنیایی‌و زانستی یەقین ناگەیەنن، بۆیە باشتر وایە بەراورد بکرێن لەگەڵ قورئان، یان فەرمودەی (متواتر).

لێرەدا پێویستە ئاماژە بکەین کە (حەنەفیەکان) بە جۆرێکی تر پۆلێنی فەرموودەیان کردووە، ئەوان دەڵێن: فەرمووده سێ جۆرن:

١. متواتر ٢. مەشهور ٣. ئاحاد ،

بۆیە (مشهور)یان جیاکردۆتەوە، پێیان وایە جۆرێکە لەنێوان (متواتر)و (آحاد)دا کە ئەو فەرموودانەن لەسەدەی یەکەمدا (آحاد)ن، بەڵام دواتر لەسەدەی دووەم‌و دواتردا شۆرەت پەیدا دەکەن‌و خەڵکێکی زۆر دەیگێڕنەوە، بۆ حوکمەکەشی دەڵێن: علمی یەقینی ناگەیەنێت، بەڵام گومانی نزیك لەیەقین دەگەیەنێت.

دیــارە ئــەم بابــەتی بــەش‌و جۆرانــەی فــەرمودە زۆر لەمــەزیاتر هەڵــدەگریَ ئەمــە تــەنها پوختەیــەك بــوو، دەکــریَ بــۆ زیــادە زانیــاری، ســەیری سەرچاوەکانی زانتسی (علوم الحدیث) بکرێت.

**٧. میتۆدو مەنهەجیەتی زانایانی فەرمودەناس:**

ڕاســتییەکی زانســتی هەیــە کــە زۆرجــار لــەبیر دەکــریَو، زۆریــش گرنگــە بۆ چۆنیەتی مامەڵە لەگەڵ فەرمودە، ئەویش ئەومیە:

کاتێــك دەگــوتریَ فــلان فــەرمودە (صــحیح)ە، ئــەبیَ بــزانین بــەپێوەرو بۆچــونی کــام لــەزانایانی فــەرمودە، چــونکە بــۆ چــون‌و پێــوانگ‌و فلەتــەریان جیاواز بووە.

بۆنمونــە: ئــەوانی لای پێشــەوای (مســلم) صــەحیحن، هــەر ئەوانــەن کــە زۆرێکیــان پێشــەوا بوخــاری بــە صــەحیحی نــەزانیون، بۆیــە نەیخســتونەتە کتێبــی (الجــامع الصــحیح)ی خــۆی. ئــەوەی لای هــەردوکیان (صــحیح)ە، (١٩٠٦) فەرمودەیــە، لەکاتێکــدا بوخــاری نزیکــەی (٣٠٠٠)ی بــە (صــحیح) زانیوە، بەلاّم (مسلم) هەمووی وەرنەگرتوون.

یــان ئــەو فەرمودانــەی (نســائی)و (إبــن ماجــە)و (تــرمــذی) کۆیــان کردۆتــەوە، هــەر ئەوانــەن لەفلتــەرەکانی (بوخــاری)و (مســلم)دا کــەوتون‌و نەیانخســتونەتە (صحاح)ی خۆیــان، بــەلاّم ئــەوان بــە (صــەحیح)یان دانــاون‌و لە (سنن)ی خۆیان کۆیان کردونەتەوە.

ئــەی بۆچــی پێشــەوا حــاکمی نەیشــاپوری (المســتدرك علــی الصــحیحین) دەنوســیَ؟ چــونکە پێــی وایــە بوخــاریو موســلم زۆر دەســتیان داگرتــووەو، زۆر فــەرمودەی (صــحیح)یان قبــوڵ نــەکردوە، بۆیــە ئــەو هــاتووە لەســەددی

چـــواردا بـــەجیا ئەوانـــەی هێناوەتـــەوە کـــە ئـــەوان نەیانهێناونەتـــە نـــاو کتێبەکانیان.

بۆیـــە ئەگـــەر زانایایـــەکمان دی ڕەخنـــەی لەشـــێوەکارو مەنهـــەجی هـــەرکام لـــەو زانایانـــە هـــەبوو، نابـــێ پێمـــان ســـەیر بـــێ، یـــان ڕەخنـــەبارانیان بکـــەین.. پێشـــتر وتمـــان پێشـــەوا دارەقـــوتنی ڕەخنـــەی لەمەنهـــەجی بوخـــاری گرتـــووە، کەســـیش ڕێـــی لێ نـــەگرتووە، یـــان خۆمـــان دەبیـــنین کـــە (ابـــن حجـــر العســـقلانی) کـــە نازنـــاوی (أمـــیر المـــؤمنین في الحـــدیث)ی دراوەتـــێ لـــەدەیان جێگـــەی (فـــتح البـــاری)دا کـــە شـــەرحی بوخـــاری کـــردووە، ڕەخنـــە لـــەبوخاری دەگـــرێ، یـــان فـــەرمودەکان بـــە لاواز دادەنـــێ، بـــە مـــەرجێ یەکـــەم سەرچـــاوەی متمانـــە پێکـــراوە لەڕافـــەی فـــەرمودەدا، بەتایبـــەتی لـــەنێو ڕافـــەکانی بوخاریدا.

بـە کـورتی دەبـی ئێمـەش لەسـەرهەمان ڕێچـکەی زانایـانی پێشـوو بـڕۆین، واتـــە ڕەخنـــەمان لەهەرکـــەس و هـــەر مەنهـــەجێك زانســـتیانە بـــێ و نیـــەتمان دڵســـۆزیی بـــێ بـــۆ خزمـــەتی قورئـــان و فـــەرمودە، دوور لەدوبارەکردنـــەوەی قسەی کەسانی تر، یان تەشهیرو ناو زڕاندن.